

# فێربوونی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر

## Computer using with windows xp

هێمن مەلا کەریم بەرزنجی

Hemn_barznji@yahoo.com

hemnbarznji@netscape.net



ئەم بەرهەمەپێشکەشەبە:

*هەموو ئەوانەی گەڕیدەی نوێترین تەکنەلۆژیای سەردەمن.

*هەموو ئەوانەی بۆ ساتێکیش بێت خۆشم ویستون بەتایبەت هاوڕێکانم.

*هەموو ئەوانەی بە نیگایەکیش بێت ئەوینم بۆیان هەبووە ،بەتایبەت :شادە،هاوژین ،لەری.

*هەموو ئەو مامۆستایانەی فێریانکردم چۆن پێبگەم،بەتایبەت:سۆران نەریمان و،د.محمد خظرو،د.موحسین ابوبکر محمد.

کتێبی: فێربوونی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر

نووسین وئامادەکردنی:هێمن مەلا کەریم بەرزنجی

پیتچنین:جوان شابان چنگیانی

نەخشەسازی ناوەوە: ڕۆزای زەبیحی

ساڵی:2005

تیراژ:1000دانە

هەڤدەهەمین بەرهەمی کتێبی نووسەر



**کورتەیەکی مێژوویی:-**

مێژووی سەرهەڵدانی ئامێرەکانی ژماردن فرە کۆنەو، دەگەڕێتەوە بۆ چەندین سەدە لەمەوپێش. کەچی لەسەدەی هەڤدەهەمی زاییندا ئامێرێکی تازە دروستکراو کەبۆ کاری بیرکارییانە بەکاردەهات، وە ساڵی 1960 ز- زانای ئینگلیزی ویلیام ئۆترد ئامێرێکی بەناوی (ڕاستەی ژماردن) دروستکردو، هێشتا تەمەنی ڕاستەی (ویلیام) نەگەیشتبووە (دە) ساڵ کە (پاسکاڵ) ئامێرێکی بەناوبانگی دروستکردو هەر بەناوی خۆشییەوە ناوی لێنا (ژمێرەری پاسکال – Pascal calculator) کە کاری کۆکردنەوەو لێدەرکردنی بە ئەنجامدەگەیاند، هەتا ئەوکاتەی (لیبنزی) زانای ئەڵمانی لەساڵی (1673 ز)دا پەرەی پێداو، کرداری لێکدان و دابەشکردنی خستە پاڵ دوو کردارەکەی پێشوو.

زانای ئینگلیزی (چارڵز باباش) لەساڵی (1823 ز)دا ژمێرەرێکی میکانیکی دروستکردو، ناوی لێنا: (ئامێری شیکردنەوە) وە دکتۆر (هێرمان هۆلریس) لەساڵی (1890 ز) دەستی دایە دروستکردنی ئامێرێکی ژمێرەر تاوەکو لەکرداری سەرژمێریکردنی ئەمریکادا کارئاسانیان بۆ بکات.

لەساڵی 1946 ز دا، هەردوو زانا (جون مۆو شلی و ئیکێرت) ی ئەندازیار لە زانکۆی پێنسلڤانیا) توانیان یەکەم کۆمپیوتەری ئەلکترۆنی دروست بکەن، کەناویان لێنا (کە کورتکراوەی وشەکانی: ENIAC) (electronically numerical integrator and calculator) وە لەهەمان کاتدا EDSAC, EDVAC, ئامێرەکانی (UNIVAC) لە وولاَتانی: (بریتانیاو فرنساو ڕوسیا) دروستکرا.

**Slide ruler**






**UNIVAC COMPUTER SYATEM**





لەدونیای ئەمڕۆدا گرنگیدان بە کۆمپیوتەر دەگەڕێتەوە بۆ تایبەتمەندییەکانی کە ژمارەیەکی زۆرەو لێرەدا گرنگترین و گشتی ترینیان باسدەکەین کەئەمانەن:-

1- خێرایی لە کارکردندا.

2- ووردی لە کاردا.

3- دووبارەکردنەوە.

4- هەڵگرتن و پاراستن و گێڕانەوەی زانیارییەکان.

5- بەکارهێنانی کۆمپیوتەر وەك ئامێرێکی دیجیتاڵی لە پەیوەندی نوێدا.

% % % % % % % % % % % % % %

# بەشەکانی کۆمپیوتەر



کۆمپیوتەر لەسێ بەش پێکهاتووە، کە گرنگە بەکورتی ئاماژە بەهەریەکەیان بکەم وبەکورتی لەسەریان بدوێم بۆئەوەی هیچ نەبێت تۆی بەکارهێنەر لانی کەم ناوەکانیان بزانیو کەمێك لەبارەیانەوە فێرببیت.

یەکەم/ بەشە ڕەقەکان – Hardware

مەبەست لەبەشە ڕەقەکان هەموو ئەو پێکهاتانەن کە ئامێری کۆمپیوتەرەکەیان پێکهێناوەو، لەبەرچاودان و، دەیان بینین و بە دەست لێدانیان هەستیان پێدەکەین، کە ئەگەر بە ووردیو بەتەواوی لێیان بدوێین ئەوا پێ ڕاناگەین، چونکە بۆ خۆی هاردوێر کە ڕستەی کتێبێکی تایبەتیە، بەڵام ناچارم بەکورتی باسیان بکەم بۆئەوەی تۆی فێرخواز ئاشنا بیت پیچیان کە ئەمانەی خوارەوە گرنگترینیان و گشتی ترینیانن:-

1- Motherboard – لوحە الام – تابلۆی دایك.

لەگەڵ ئەوەی فەرمانی سەرەکی ئەم بەشەی هاردوێر بەشێوەیەکی سەرەکی هەڵگرتنی پارچەکانی دیکەیە، کەچی بە یەکێك لەبەشە گرنگەکانی هاردوێر دادەنرێت کە:



(پرۆسێسەر- ڕام – کارتی شاشە – کارتی دەنگ و ...) هەڵگرتووە.

**2- CPU = Central Processing Unit**

بە گرنگترین بەش ناوزەند دەکرێت کە بە مێشکی (brain) کۆمپیوتەر ناسراوە، کاری هەڵگرتنی بەرنامەیە لەبیری سەرەکیدا (Main memory) و، خۆی (C.P.U) بەمانای یەکەی بنچینەیی کۆمپیوتەر، یان یەکەی چارەسەرکردنی ناوەندی دێت، کە پێکهاتووە لە:

* یەکەی دەست بەسەراگرتن. Control Unit = C.U
* یەکەی ژمارەو مەنتق. A.L.U
* یەکەی بیری سەرەکی. M.M.U = Main Memory Unit

**3- In put Unit یەکەکانی داغڵکردن.**

مەبەست لە یەکەکانی داغڵکردن ئەو بەشانەیە کە بەهۆیەوە دەتوانین ئەو زانیاری داتایانەی کە هەمانە داغڵ بە کۆمپیوتەرەکەی بکەین و بیکەینە ناو کۆمپیوتەرەکەوە بەمەش ئەوکارەی دەمانەوێت لەناو کۆمپیوتەرەکەدا ئەنجامدەدرێت کە پاشانیش بەهۆی یەکەکانی ئێخراجەوە دەتوانین ئەنجامەکەی ببینینەوە. Out put Unit

یەکەکانی داغڵکردن زۆرن، وەڵێ ئێمە تەنها لەسەر دوانیان دەدوێین کە زۆر باون لەناو خەڵکدا جێگەی بایەخ بەکارهێنەرەوە دەبێت بیانناسێت و شارەزایی هەبێت لەبارەیانەوە، بەڵام ئەوانی دی کە زۆر گرنگ نین تەنها ئاماژە بە ناوەکانیان دەکەین، بەم شێوەیە:-

**@ کیبۆرد – Key board:**

ئەو بەشەیە لە هاردوێر کە هەمیشە لەبەردەستماندایە زۆر بەکاریدەهێنین و سوودی لێوەردەگرین بۆ پەیوەندیکردن بە ئامێری کۆمپیوتەرەکەوە، ژمارەیەکی زۆر دوگمەی لەسەرە کەهەریەکە بەکارهێنانی خۆی هەیە یان چەند دوگمەیەک

## The CPU and Primary Storage






**Keyboard**



پێکەوە بەکارهێنانێکیان هەیە، یان چەند بەکارهێنانێك کە بەگوێرەی شوێنی کارەکەمان و جۆری بەرنامەکان دەگۆڕێت.

کیبۆرد بەگشتی دوو جۆری هەیە، ئەوانیش: (Mechanical Keyboard, Capacitive Keyboard)

@ ماوس – Mouse

ئامێرێکی بچووکی گەیەنراوە بەیەکەی بنچینەیی کۆمپیوتەر (C.P.U) کە بەجوڵاندنی سەهمێك لەسەر شاشەکە دەجوڵێت کە بەهۆیەوە شوێنی کارەکەمان و شێوەی کارەکەمان دیاریدەکەین.

ماوس بەگشتی لەسێ کلیك پێکهاتووە:-

1- کلیکی چەپ، کە بە کرتەکردن لەسەری و پەنجەنان پیایدا دەوترێت کلیك Click.

2- کلیکی ڕاست، کە بە کرتەکردنی و پەنجەنان پیایدا دەوترێت کلیکی ڕاست Right Click.

3- سکڕۆڵ، بەهۆی ئەم بەشەوە دەتوانین لاپەڕەی دیاریکراو بجوڵێنین، کە ئەم بەشە لە هەندێك ماوس دا هەیە وە لە هەندێك ماوسی دیکەدا نییە. ئێستا کە بەشەکان و دوگمەو کلیکەکانی ماوسمان زانی دەبێت بەهۆیانەوە بەکارهێنان و فەرمانەکانی ماوسیش دیاری بکەین کەخۆی لەچوار فەرماندا دەبینێتەوە، بەم شێوەیە:-

1- Click : کرتەکردن و پەنجەنانە بە کلیلی چەپی ماوسەکانداو بۆ هەندێك کارو فرمانی تایبەتی بەکاردەهێنرێت، جا ئایا کردنەوەی لیست بێت، یان OK کردن کە لەبەشەکانی ئەم کتێبەو بەرهەمەکانی دیکەشمدا بەجوانی بۆت ڕووندەبێتەوە.

2- Double click: مەبەست لە دەبڵ کلیك، دوانە کرتەکردنە، واتە: دوو جار پەنجەنان بە کلیلی چەپی ماوسەکە، یان دەتوانین بڵێین دوو جار کلیك کردنە لەسەر

Mouse - ماوس



رِونکردنەوەی جۆرەکانی کلیك...!!



click - کلیك

right click – کلیکی ڕاست



یەك كە بەشێوەیەكی گشتی ئەم دوانە كلیك كردنە فەرمانی كردنەوە (Open) ئە نجامدەدات.

3- Right click: واتە: كلیكی ڕاست كە مەبەست لێی پەنجەنانە بە دوگمەی ڕاستی ماوسەكەداو ئەمەش بۆ هەندێك مەبەستی دیاریكراوە بەكاردێت، جا كۆپی كردن بێت، یان برین، یان كردنەوە (Open)، یان هەر لیستێكی پەیوەندیدار بەوكارەی لەوكاتەدا بەئە نجامی دەگەیەنین، كە دواتر لە باسكردنی بەرنامەكاندا زیاتر ڕووندەبێتەوە.

4- Drag and Drop: بۆ هەڵگرتن و گواستنەوەی فایل، یان فۆڵدەر یان شۆرتكەت بەكاردەهێنرێت لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر، دیارە بە پەنجە داگرتن لەسەر كلیك وڕاكێشان و هەڵگرتنی ئەوشتە تا شوێنی دیاریكراو پاشان پەنجە لابردن لەسەر كلیك بەئە نجامدەگات.



Drag and drop ڕوونكردنەوە

@ ئامێرەكانی دیكەی داغڵكردن

جگە لەو دوو خاڵەی سەرەوە (ماوس و كیبۆرد) ئامێرو بەشی دیكەشمان زۆرە كەدەبێتە یەكەی داغڵكردن In put Unit و پێویست ناكات لێرەدا شوێنیان پێوە داگیربكەین و تەنها ئاماژەیان پێدەكەم و باسكردنی تەواویان هەڵدەگرم بۆ شوێنێكی دیكە ... بەم شێوەیە:-

1- سكانەر Scanner

2- Touch Screen

3- Optical Character Recognition

4- Magnetic Ink Character Recognition (MICR)

5- Pen-based in put

6- Audio in put

7- Sensors

8- Radio Frequency identification (RFID)

## 4- Case كەیس

كەیس - case





ئەو بەشەی کۆمپیوتەر دەگرێتەوە کە هەموو پارچەکانی یان ڕاسترە بڵێم: زۆربەی پارچەکانی، کۆمپیوتەر لەخۆ دەگرێت وەك C.P.U و Mother board و ... کە لێرەدا باسیان ناکەین چونکە پێشتر کورتە ئاماژەیەکمان پێیداو لەبەرهەمی تایبەتیشدا بەووردی باسی دەکەین، ئەگەر باری تەندروستیم تەواوبێت و هیچ گرفتێکم نەبێت، پشت بەخودای مەزن و دلۆڤان، وەلێ لێرەدا پێویستە ئاماژە بە هەردوو دوگمەی گرنگ بدەم لەسەر ئەم بەشەی ( Case-کەیس) ئامێرەکە کە گرنگەو ڕۆژانە بەکاریدەهێنین:-

یەکەم/ Power

بە پەنجەنان بە دوگمەی داگیرساندن Power دا کە بەستراوە بەیەکەی بنچینەیی کۆمپیوتەرەوە ( C.P.U ) ئەوا کۆمپیوتەرەکە دادەگیرسێت، بە مانایەکی تر دەچێتە ناو بەرنامەی ویندۆسەوەو پاش کەمێك چاوەڕوانی دیسك تۆپ Desktop چالاکدەبێت.

دووەم/ Re-Start :

دوگمەی دووەمی زۆر گرنگ و پڕ بایەخی سەر کەیسەکەیە کە فەرمانی دووبارە دەستپێکردنەوە ئەنجامدەدات، واتە: جارێکی دی کۆمپیوتەرەکە دەستدەکاتەوە بە کارکردن، کە ئەم دوگمەیە لەکاتی تایبەتیدا بەکاردەهێنرێت وەك جامبوونی ( وەستان ) ی کۆمپیوتەرەکە.

5- Out Put devices : یەکەکانی، یان هۆیەکانی ئیخراجی زانیاری بەو بەشانە یان پارچانە دەوترێت کەکاریان وەرگرتنی زانیارییە بەهۆیانەوە، دوای ئەوەی زانیارییەکانمان داغڵکردن بۆناو کۆمپیوتەرەکەو ئەویش کاری تەواوی لەسەر کرد، واتە: ئەو بەشانەیە کە ئەنجامی کارەکانی پێدەبینین کە چەند دانەیەکن، بەڵام تەنها بەکورتی ئاماژەیان پێدەکەین.

ئەم وێنەیە power و Re-start ڕووندەکاتەوە



Re-start power

چالاك بوونی دیسك تۆپ ڕووندەکاتەوە





Monitor

Speaker



speaker – موکەبەرە – بلندگۆ

## @ Monitor:

بریتییە لە شاشەیەك Screen کە بەکارهێنەر User بەهۆیەوە دەتوانێت زانیاری ببینێت و، وەربگرێت، واتە: ئەو گۆڕانکارییانەی لەناو کۆمپیوتەردا بەئە نجامدەگات دەتوانین لەڕێگەی Monitor ەوە بیبینینەوە.

@ Printer

مەبەست لەو ئامێرەیە کە بەهۆیەوە فایل و زانیارییەکان چاپدەکرێت و سوودی لێوەردەگیرێت و کارئاسانی تەواو بۆ بەکارهێنەر دەکات.

بەگشتی سێ جۆر پرنتەرمان هەیە، ئەوانیش:-

* Dot Matrix Printer
* Line Printer
* LaserJet Printer

@ جگە لە (پرێنتەر و مۆنیتەر) هەندێك ئامێرو بەشی دیکەمان هەیە کە لەژێر خانەی یەکەکانی ئیخراج Out Put Unit دا جێگەیان دەبێتەوە، ئەوانیش:-

1- Plotter
2- Speaker
3- Cathode ray tube (C.R.T)
4- Printers
5- Audio out put
6- هۆیەکانی پەیوەندی

/././././././././././././././././././././././././././././././././././././././.

## دووەم/ Soft ware – بەرنامەکان

## (بەشە نەرمەکان):

مەبەست لە بەشە نەرمەکان هەموو ئەو بەرنامانەیە کە ڕۆژانە کاریان پێدەکەین و، ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەیان زیاد دەکات و بەرەو پێشیش دەچن، ئەمە جگە لە نوێپەرەیتین سیستەمیش کە هەر لەڕیزی بەرنامەکان Soft ware دایە، وە هەموو



ئەو ئه‌پلیكه‌یشنانەش كە كاری هاردوێر hard ware work دروستدەكەن. نموونە بۆ بەشی سۆفت وێر زۆر زۆرە، ئێمە تەنها ناوی چەند بەرنامەیەك دەنووسین بۆ زیاتر ئاشنای تۆی خوێنەرو، زانستخوازی خۆشەویست، وەك: ( Word- Excel- NT workstation- windows 95-windows 98- windows xp- windows me- Nets Cap- Communicator- Adob Acrobat Reader- Dos, ...)

/./././././././././././././././././././././././././././././././././././././././.

## سێهەم/ Firm ware – فێرم وێر:-

مەبەست لە فێرم وێر یەكگرتنی هاردوێر (بەشە ڕەقەكان) و سۆفت وێر (بەرنامەكان)ە لەناو چپە Chips گرێگەكانی ناو مایكرۆ كۆمپیوتەردا micro computer كە دەتوانین دەستی لێبدەین، یان هەستی پێبكەیت وەك بەشە ڕەقەكان Hard ware، بەڵام لەگەڵ بەرنامەكاندا دەنووسین لەناویاندا وە لە ئەنجامدا دەگەینە ئەوەی پێی بڵێین فێرم وێر Firm ware.

تا ئێرە ناساندن و، كورتەیەكی مێژوویی بوو لەبارەی كۆمپیوتەرو بەشەكانییەوە، ئیدی پێویست دەكات بزانین چۆن كۆمپیوتەر بەكاردەهێنین و چۆن دایدەگیرسێنین و چۆن دەیكوژێنینەوە چۆن كاری لەناودا دەكەین كە لەبەرئەوەی زۆرترین زانیاری بدەین بەتۆی ئاشقی ڕێگەی زانست هەوڵدەدەین سوود لە ئەزمی فێركاری جیهانی وەربگرین كە فێركردنی وێنەییە، سەرەڕای هەوڵدان نمان بۆ بەكارهێنانی كورتترین ڕێگەو ئاسانترین شێواز. چونكە كاتێك مرۆڤ لەسەرەتای فێربووندایە حەز بەڕێگەی دوورو درێژو ئاڵۆز ناكات، لەبەرئەوەی درەنگتر تێی دەگات و فێر دەبێت.

ویندۆی ئێكس پی یەكێك لە بەرنامەكان




# Power point

## یەكیـــــــــــــــك لە بەرنامەكان





# داگیرساندنی کۆمپیوتەر

دوای ئەوەی ئەو پلاکەمان داگیرساند کە پارێزەری کۆمپیوتەر (U.P.S) ی پێوەیە، یان داگیرساندنی ئەو پلاکەی کە تەقسیمی تایبەت بە کۆمپیوتەرەکەمانی پێوەیە، پەنجە دەنێین بە دوگمەی داگیرساندنی Power یو. پی. ئێسەکە، یان تەقسیمەکە، پاشان پەنجە دەنێین بە دوگمەی داگیرساندنی Power ی سەر ڕووی کەیسەکە، کە دوگمەیەکی تا ڕادەیەك گەورەیە لەچاو دوگمەی دەستپێکردنەوەدا Re-start و هێمای @ کە ئەم هێمایە لەسەر هەموو دوگمەیەکی داگیرساندن هەیەو پاشانیش پەنجە دەنێین بە دوگمەی داگیرساندنی شاشەکەدا Monitor . لەوکاتەوەی پەنجە دەنێین بە دوگمەی داگیرساندنی سەر کەیسەکەدا کۆمپیوتەرەکە دەست دەکات بەکارکردن و سەرەتای کرداری هەڵگرتن ... Loading کە پێویست دەکات کەمێك چاوەڕێبکەین تاوەکو دەچێتە ناو بەرنامەی ویندۆوەو ڕووی شاشەکە چالاك دەبێت و ئایکۆن و شۆرتکەتەکان دەردەکەون.



دەرکەوتنی ئایکۆن و شۆرتکەتەکان

### کردنەوەی ئایکۆنەکانی سەر ڕووی شاشە

لەسەر ڕووی شاشەکە Desktop ی بۆمانکراوەتەوە چەند ئایکۆن Icon و کورتکراوەی بڕەرو shortcut هەیە کە ڕۆژانەو بەگوێرەی کارکردنمان پێویستمان پێی دەبێت و دەبێت بزانین چۆن دەیانکەینەوە، کە زۆر ئاسانەو دوو ڕێگەمان هەیە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە:-

ڕێگەی یەکەم/ نموونە لەسەر تەنەکە خۆڵ Recycle bin :

1- سەهمی ماوسەکە ببەرە سەر هێمای تەنەکە خۆڵەکە، کە لەژێریدا نووسراوە Recycle bin .

وێنەی 1



وێنەی 1



2- پاشان دوانە کلیکی double click لەسەر بکە، دەبینی ئایکۆنی تەنەکە خۆڵەکە چاڵاک دەبێت ودەکرێتەوە. بڕوانە وێنەی 2

ڕێگەی دووەم/ نموونە لەسەر کۆمپیوتەرەکەم My computer:-

1- سەرەی ماوسەکە ببەرە سەر هێمای کۆمپیوتەرەکەم My computer.

2- کلیکی ڕاستی لەسەر بکە.

3- لەو لیستە نوێیەی بەهۆی خاڵی دووەمەوە بۆت کراوەتەوە سەرەی ماوسەکە بهێنەرە سەر بەشی کردنەوە Open،کلیک لەسەر بکە . دەبینی ئایکۆنەکە چاڵاک دەبێت و پاش کەمێك مایکۆمپیوتەر چاڵاک دەبێت ودەکرێتەوە، بەم شێوەیە.بڕوانە وێنەکانی 3و4و5



وێنەی2





:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/:/

## کردنەوەی بەرنامەکان

دیارە ئەگەر کورتکراوەی بڕداوی shortcut بەرنامەکانمان لەسەر ڕووی شاشەکە هەبێت ئەوا دەتوانین بەو دوو ڕێگەی کردنەوەی ئایکۆنەکان بیانکەینەوە بێ ئەوەی ئەم ڕێگەیەی خوارەوە بەکاربهێنین، بەڵام ئەگەر shortcut –مان نەبوو ئەوا یان دەبێت بۆی دروست بکەین تا بتوانین یەکێك لە دوو ڕێگەکەی کردنەوەی ئایکۆنەکانی سەر ڕووی شاشەکە بەکاربهێنین، یان دەبێت ئەم ڕێگەی خوارەوە بەکاربهێنین بەم شێوەیە:-

1- سەرەی ماوسەکە ببە سەر دوگمەی دەستپێکردن start کە دەکەوێتە بەشی Task bar ی ڕووی شاشەکە Desktop.وێنەی6

2- پاشان پەنجە بنێ بە کلیکی چەپدا click کە بە هۆیەوە لیستی پێویستیەکانی task menu دەکرێتەوە. بڕوانە وێنەی 7



3- سەهمی ماوسەکە ببەرە سەر بەشی هەموو بەرنامەکان all programs و کلیک لەسەر بکە کەبەهۆیەوە لیستێکی نوێ دەکرێتەوە. بڕوانە وێنەی8

4- سەهمی ماوسەکە ببە سەر ئەو بەرنامەیەی کە دەتەوێت بیکەیتەوە، ئێمە دەمانەوێت بەرنامەی وۆرد بکەینەوە بۆیە سەهمی ماوسەکە دەبەینە سەر office 2003 کە پاشان لیستێکی تازەی بچووکمان بۆ دەکرێتەوە کە بەرنامەکانی ئۆفیسی 2003 ی تیادایە، سەهمی ماوسەکە دەبەینە سەر بەرنامەی Microsoft Word و کلیک click لەسەر دەکەین. بەم شێوەیە بەرنامەی تایبەت بە نووسینمان بۆ دەکرێتەوەو چالاکدەبێت لەسەر ڕووی شاشەکە، کە بەرنامەی Microsoft Word 2003 یە.

سەرنج:- ئەم چوار خاڵەی سەرەوە (1، 2، 3، 4-) کە بۆ کردنەوەی بەرنامەکان بەکارمان هێنا، بێ جیاوازی بۆ کردنەوەی هەموو بەرنامەیەك بەکاردێت و ناگۆڕێت جا ئەو بەرنامەیە یاری بێت یان بەرنامەکانی کۆمپانیای ئەدۆب Adobe Photoshop CS یان ئەنتی ڤایرەس Panda و ...، یان لەوحەی دەست بەسەراگرتن Control Panel و My Document و My computer و Run و Search و ...، یان هەر بەشە بەرنامەیەکی دیکە کە خۆمان دامانبەزاندبێ، یان کارمان پێی بێت.

## داخستنی بەرنامەکان

بێگومان دوای ئەوەی بەرنامەیەك دەکەیتەوەو کارت پێی نابێت دەبێت داییخیتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش چەند ڕێگەی جیاواز هەیە، کە ئەو ڕێگانە لەسەر بەرنامەی نووسین Word جێبەجێ دەکەین بەم شێوەیە:-

ڕێگەی یەکەم/ بەهۆی فەرمانی داخستنی شریتی ناونیشانەوە. لە بەرنامەی وۆرد و هەموو پە نجەرەو




وێنەکانی 3و4و5






بەرنامەکانی دیکەشدا بەشێك هەیە کە بە شریتی ناونیشان Title Bar دەناسرێت و جگە لەناوی ئەو بەرنامەیە، یان پەنجەرەو دۆکیومێنتە سێ دوگمەشی لەسەرە کە یەکەمیان بۆ مەبەستی داخستنی ئەو بەرنامەیە، یان پەنجەرەیە سوودی لێوەردەگیرێت ئەویش بە کلیك کردن لەسەری، بەم شێوەیە:-

1- سەهمی ماوسەکە ببە سەر هێمای داخستنی Close ی سەر شریتی ناونیشان Title Bar .

بڕوانە وێنەی8

2- پاشان پەنجە بنێ بە کلیك click دا بەمەش بەرنامەکە، یان پەنجەرەکە دادەخرێت و لەسەر ڕووی شاشەکە Desktop لادەچێت.

ڕێگەی دووەم/ بەهۆی فەرمانی دەرچوونی بەرنامەکەوە. هەر بەرنامەیەك بکەیتەوە فەرمانێکی تێدا هەیە تایبەت بە داخستنەوە، دەرچوون Exit لەو بەرنامەیەوە بەرنامەی وێردیش بێبەش نیە لەم فەرمانە بەم شێوەیە:-

1- سەهمی ماوسەکە ببەرە سەر فەرمانی File لە شریتی لیستەکاندا.

وێنەی9

2- کلیك لەسەر فەرمانی File بکە کەبەهۆیەوە لیستێکت بۆ دەکرێتەوە.

وێنەی10

3- سەهمی ماوسەکە بهێنە سەر فەرمانی Exit و کلیك click لەسەری بکە، بەمەش بەرنامەی وێرد بۆ دادەخرێتەوەو لەسەر شاشەکە لادەچێت و نامێنێت.

ڕێگەی سێهەم/ بەهۆی دوگمەکانی کیبۆردەوە

بۆ داخستنەوەی بەرنامەو پەنجەرەکان دەتوانین بۆ کارئاسانی و، کورتکردنەوەی هەنگاوەکان سوود لە دوگمەکانی کیبۆرد وەربگرین ئەویش بە پەنجەنان بە هەردوو دوگمەی Alt و F4 پێکەوە، واتە: سەرەتا پەنجەیەکت بنێ بە

وێنەی8




وێنەی9






دوگمەی Alt داو پاشان بێنەوەی پەنجەی سەر دوگمەی Alt لابیەیت پەنجەیەکی دیکە بنێ بە دوگمەی F4 دا.

سەرنج:- ئەم سێ ڕێگەیەی داخستنی بەرنامەکان بێ جیاوازی بۆ داخستنی هەموو بەرنامەیەك بەکاردەهێنرێت.

%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%

# دروستکردنی فۆڵدەر

# Folders

ئەگەر دەتەوێت لەسەر ڕووی شاشەکە، یان لە یەکێك لە هاردەکاندا فۆڵدەرێك دروست بکەیت، ئەوا ئەم هەنگاوانە بگرەبەر کەمن لەسەر ڕووی شاشەکە Desktop دروستی دەکەم، بەم شێوەیە:-

1- لەسەر شوێنێکی چۆڵی سەر شاشەکەدا کلیکی ڕاست Right click بکە.

بڕوانە وێنەی11




وێنەی 11

2- لەو لیستە نوێیەی بۆتدەکرێتەوە سەهمی ماوسەکە ببەرە سەر بەشی نوێ New کە بەهۆیەوە لیستێکی بچووکمان بۆ دەکرێتەوە.

بڕوانە وێنەی 12




وێنەی12

3- لەو لیستە بچووکەی بۆمانکراوەتەوە سەهمی ماوسەکە ببە سەر Folder و کلیکی لەسەر بکە.

بڕوانە وێنەی 13





دەبینیت فۆڵدەرێك لەسەر شاشەکە Desktop دروست دەبێت کە لەژێریدا نووسراوە New Folder و دەتوانیت دواتر کلیك double click لەسەر ئەم نووسینە New Folder بکەین کە بەمەش چالاکدەبێت و، دەتوانین ناوێکی نوێی لە جێگەی بنووسین و دواتر پە نجە بنێین بە دوگمەی Enter ی سەر رووی کیبۆردەکەدا بۆئەوەی ئەو ناوە جێگیر ببێت، ئێمە ناومان لێنا Computer using . چونکە بابەتەکانی ئەم کتێبەی تیا دادەنێین. وێنەی14

سەرنج:- ئەگەر تۆی بەکارهێنەری کۆمپیوتەر ویستت ئەم فۆڵدەرە لە شوێنێکی دیکەدا دروست بکەیت بۆ نموونە لە یەکێك لە هاردەکاندا، یان لە فلاشدا، یان لە فلۆپیدا، هیچ جیاوازییەکی نییە دوای ئەوەی بەهۆی یەکێك لە رێگەکانی کردنەوەی ئایکۆنەکانەوە هاردەکەمان کردەوە، یان فلاش و فلۆپییەکەمان کردەوە، ئەم سێ خاڵە جێبەجێ دەکەین.

وێنەی14



دروستبوونی فوڵدەر لەسەر رووی شاشە

---

New folders ⟶ computer using

وێنەی کۆتای گۆرینی ناوی فوڵدەرە دروستبووەکە





# دروستکردنی Shortcut




بۆئەوەی بتوانین بەهۆی دوو ڕێگەکەی کردنەوەی ئایکۆنەکانەوە بەرنامەکان بکەینەوە، دەبێت کورتکراوەیەکی بڕدراو shortcut بۆ ئەو بەرنامەیە دروست بکەین، تا لەسەر ڕووی شاشەکەدا Desktop هەبێت و هاوکاریمان بکات لە کارەکانمان بەم شێوەیە :-

1- سەهمی ماوسەکە ببە سەر دوگمەی دەستپێکردن Start و کلیک لەسەر بکە، کە بەهۆیەوە لیستی تاسک Task menu مان بۆ دەکرێتەوە.

وێنەی 1




2- سەهمی ماوسەکە ببە سەر بەشی هەموو بەرنامەکان all program کە بەهۆیەوە لیستێکی نوێمان بۆ دەکرێتەوە کە هەموو بەرنامەکان لەخۆ دەگرێت.

وێنەی2




3- سەهمی ماوسەکە ببە سەر ئەو بەرنامەیەی کە دەتەوێت، کورتکراوەی shortcut بۆ دروستبکەیت و کلیک ڕاستی Right click لەسەر بکە، کە بەهۆیەوە لیستێکی بچووکمان بۆ دەکرێتەوە.

وێنەی 3



-4 لەو لیستە بچووکەی بۆمانکراوەتەوە سەهمی ماوسەکە بەرە سەر Create shortcut و کلیکی لەسەر بکە.

بڕوانە وێنەی 4




وێنەی 4

بەم شێوەیە شۆرت کەتێك دروست دەبێت کە دەتوانین بەهۆی هەڵگرتن و ڕاکێشانەوە drag and drop بیهێنینە سەر ڕووی شاشەکە desktop.

بڕوانە وێنەی 5




وێنەی 5

یان سەهمی ماوسەکە ببە سەر بەشی send to و کە بەهۆیەوە لیستێکی بچووکترمان بۆ دەکرێتەوە لەو لیستە بچووکترەدا کلیك لەسەر Desktop بکە.

بڕوانە وێنەی6




وێنەی 6

بەم شێوەیە shortcut –ێکمان بۆ دروست دەبێت لەسەر ڕووی شاشەکە. دیارە جگە لەم ڕێگەیە دەتوانین بەشێوەو ڕێگەیدیکەش دروستی بکەین، بەڵام ئەم شێوەیەی ئێمە باسمان کردووە زۆر ئاسانەو باوترینیانە، دەنا دەتوانیت لەسەر شوێنێکی چۆڵی ڕووی شاشە Desktop کلیکی ڕاست بکەو Right click پاشان سەهمی ماوسەکە بهێنە سەر بەشی New و پاشان create shortcut و بەو شێوەیە :



# ڕێکخستنی ئایکۆنەکانی سەر ڕووی شاشە

ئایکۆن و، شۆرتکەتەکانی سەر ڕشووی شاشە لە قەبارەو شێوەو ناوو جۆرو زۆر شتی تردا جیاوازن، هەر لەبەر ئەمەشە دەتوانین بەگوێرەی ئەو جیاوازییانە ڕێکیان بخەین وڕیزیان بکەین لەسەر ڕووی شاشەکە بەم شێوەیەی خوارەوە:-

1- لەسەر شوێنێکی چۆڵی سەر ڕووی شاشەکە Desktop کلیکی ڕاست Right click بکە، کە بەهۆیەوە لیستێکمان بۆ دەکرێتەوە.




وێنەی 1

2- سەهمی ماوسەکە بهێنە سەر بەشی ڕێکخستنی ئایکۆن بە Arrange Icon: کە بەهۆیەوە لیستێکی نوێمان بۆ دەکرێتەوە، کە لەچەند شێوەیەك پێکهاتووە بەم شێوەیە.




وێنەی 2

* ئەگەر کلیك لەسەر Name بکەین ئەوا بەگوێرەی یەکەم پیت و دووەم پیتی ئەو ناوەی لەژێر ئایکۆنەکەدا نووسراوە بۆمان ڕیز دەکات، واتە: بە گوێرەی ABCD ی زمانی ئینگلیزی.




وێنەی3






* ئەگەر کلیك لەسەر Size بکەین ئەوا بەگوێرەی حەجمەکانیان ئایکۆنەکانمان بۆ ڕیز دەکات.

وێنەی 4




* ئەگەر کلیك لەسەر Type بکەین ئەوا بەگوێرەی جۆرەکانیان ئایکۆنەکانمان بۆ ڕیز دەکات.

وێنەی 5




* ئەگەر کلیك لەسەر Modified بکەین، ئەوا بەگوێرەی بەرواری دواهەمین ڕێکخستن ئایکۆنەکانمان بۆ ڕێك دەکات.

وێنەی 6




* ئەگەر کلیك لەسەر Auto Arrange بکەین، ئەوا بەشێوەیەکی خۆیی (ئۆتۆماتیکی) ئایکۆنەکانمان بۆ ڕێکدەخات.

وێنەی 7






* ئەگەر کلیك لەسەر Align to Grid بکەین ئەوا ئایکۆنەکان ڕێکدەخات بۆ گرایدەکان.

وێنەی 8




* ئەگەر کلیك لەسەر Show Desktop Icon بکەین ئەوا ئایکۆنەکانی سەر ڕووی شاشەکە Desktop پیشاندەدرێت و دیاردەبێت وە بە پێچەوانەوە.

وێنەی 9




* دەتوانین کلیك لەسەر lock Web Items On Desktop بکەین بۆ لۆك کردن و نەگۆڕانی بڕگەکانی وێب لەسەر ڕووی شاشەکە Desktop .

وێنەی 10




*دەتوانین کلیك لەسەر run desktop cleanup wizardبکەین کەبەهۆیەوە ئەم دایەلۆگ بۆکسەمان بۆ دەکرێتەوەوە دەتوانین بەهۆیەوە شۆرتکەتەکانی سەردیسك تۆپ بگۆڕین و هەڵبژێرین .

بڕوانەوێنەی کۆتای



# فەرمانەکانی لیستی تاسک

# Task Menu

ئەگەر کلیک لەسەر دوگمەی دەستپێکردنی Start سەر شریتی تاسک Task bar بکەین، ئەوا لیستێکمان بۆ دەکرێتەوە کە پێی دەڵێن: Task Menu، دەکرێت بڵێین لە دوو بەش پێکهاتووە، ئەوانیش لیستی هەموو بەرنامەکانە All program لەگەڵ فەرمانە پەیوەندیدارەکانی ئۆپەرەیتین سیستەمی کۆمپیوتەرەکە کە لێرەدا ویندۆزی XP – یە.

بڕوانە وێنەی 1

وێنەی 1




بۆ تێگەیشتن لە کارو چالاکی هەر بەشەیان و پاشانیش فەرمانی ناو هەر بەشێکیان بەکورتی و بە نموونەوە هەندێکیان ڕوونەدەکەینەوە:–

بەشی یەکەم/ لیستی هەموو بەرنامەکان All program

دوای ئەوەی لیستی تاسکمان کردەوە، دەتوانین کلیک لەسەر ئەم بەشی ( هەموو بەرنامەکان ) بکەین کە دەتوانین بەهۆیەوە هەر بەرنامەیەکمان بوێت بیکەینەوە. ( وەک لە پێشترو لە کردنەوەی بەرنامەکاندا ڕوونمان کردەوە ).

وێنەی 2




وێنەی 2

بەشی دووەم/ فەرمانەکانی پەیوەند بە ئۆپەرەیتین سیستەم
دوای ئەوەی کلیکمان لەسەر دوگمەی دەستپێکردنی Start ی سەر رووی شریتی تاسك Task bar كرد لیستی تاسكمان Task Menu بۆ دەكرێتەوە كە جگە لە بەشی هەموو بەرنامەکانی All program کۆمەڵێك فەرمانی دیکە لەخۆ دەگرێت

بڕوانە وێنەی 3

وێنەی 3




کە بەکورتی ڕوونیان دەکەینەوە:-

1- Run...:
ئەم فەرمانە زۆر سوودی لێدەبینرێت و بەزۆر شێوە کاردەکات وەك:-

وێنەی 4




* بۆ کردنەوەی ماڵپەری ئینتەرنێتی.
بۆنموونە:
www.Yahoo.com
لەناویدا بنووسەوە OK بکە.

بڕوانە وێنەی 4



* بۆ سڕینەوەی فایلە زیادەکانی ویندۆ. لەناو لاکێشە بچووکەکەیدا بنووسە prefetch یان %temp% پاشان کلیکی OK بکە، یان Enter بکە بەمەش هەموو فایلە زیادەکانت بۆ دەردەکەوێ کە دەتوانین بەهۆی Cntrl+A هەموویان سەلێکت بکەیت و بە پەنجەنان بە دوگمەی Delete ی سەر ڕووی کیبۆردەکەشدا هەمووە بسڕیتەوە. چونکە زیادە بێکەڵکن.

بروانە وێنەکانی 5 و 6 و 7

وێنەی 5




وێنەی 6




وێنەی 7








* بۆ کردنەوەی بەرنامەش سوودی لێوەردەگیرێت Word Pad لەناو لاکێشەکەدا بنووسەو OK بکە.

وێنەی 8و 9




* بۆ دابەزاندنی Setup بەرنامە سوودی لێوەردەگیرێت.

2- Search...:

بۆ مەبەستی گەڕان بەدوای شتێکدا سوودی لێوەردەگیرێت بۆ نموونە فایلێك، یان وێنەو یان هەر شتێکی تر.







3- Help and Support...:

بە کلیك کردنی بەشی یارمەتی چالاکبێت، کە ئەگەر شارەزایی زمانی ئینگلیزیت هەبێت لەزۆر بارادا سوود پێدەگەیەنێت و کۆمەك دەکات و بەفریات دەکەوێت.






## 4- Control Panel...:

بە کلیك کردن لەسەر ئەم بەشە پەنجەرەی تایبەت بە دەست بەسەراگرتنی زۆربەی کارو چالاکی و پێکهاتەکانمان بۆ دەکرێتەوە، کە ناکرێت لێرەدا باسیان بکەین. چونکە کاتێکی زۆری دەوێت و ژمارەیەکی زۆریش لاپەڕەی پێویستە، بەڵام بەڵێن بە خوێنەران و ئاشقانی زانست دەدەم کە لەبەشی دووەمی کتێبی ویندۆزی ئێکسپیدا بە وردی ڕوونیان دەکەمەوە کە لەئاییندەدا دەردەچێت.




## 5- My Network Place...:

بە کلیك کردن لەسەر ئەم بەشە، پەنجەرەی تایبەت بە تۆڕەکان چالاکدەبێت، ئەگەر کۆمپیوتەرەکەمان تۆڕی ئینتەرنێت، یان تۆڕی کۆمەڵێك کۆمپیوتەری لەسەر بێت.




## 6- My Computer:

بە کلیك کردنی بەشی مایکۆمپیوتەرمان بۆ دەکرێتەوە کە زۆر جار پێویستمان دەبێت و دەکەوێتە بەردەستمان، بۆیە لە بابەتی کارکردن بە فلۆپی و سیدی و فلاش و کردنەوەی فایلدا باسیان دەکەین.






### 7- My Music...:

ئەم بەشە تايبەتە بە فايلاتی مۆزيكی و بە كليك كردن لەسەری چالاكدەبێت.




### 8- My Picture:

ئەم بەشەش تايبەتە بە فايلاتی وێنەو بە كليك كردن لەسەری چالاكدەبێت.




### 9- My recent Document:

بەشی (دۆكيومێنتە تازەكانم) ئەو دۆكيومێنتانە لەخۆ دەگرێت كە نوێ و تازەن و دەتوانين لێرەوە جارێكی ديكە بيانكەينەوە.




### 10- My Document:

ئەم بەشە بە كليك كردن لەسەری چالاكدەبێت كە هەموو ئەو دۆكيومێنتانە لەخۆ دەگرێت كە خۆمان لێرەدا دامان ناوە.

# بەکارهێنانی فلۆپی



فلۆپی یەکێکە لەو هۆیە یارمەتیدەرانەی کەبۆ گواستنەوەی زانیاری لە کۆمپیوتەرێکەوە بۆ کۆمپیوتەرێکی تر سوودی لێوەردەگیرێت و زۆر سووکەو جێگەش کەم دەگرێت و نرخەکەشی هەرزانە، بەڵام گرفتی ئەوەی هەیە کە زوو خراپ دەبێت و، تەنها بۆ دوو سێ جارو بۆ ماوەیەکی کەم بەکاردەهێنرێت و دواتر دەبێت فڕێ بدرێت و، تا رادەیەکیش قەبارەکەی کەمەو تەنها 1.44 MB زانیاری دەگرێت.



لێرەدا بەکورتی باس لە چۆنێتی هەڵگرتن و پاراستنی بابەت و زانیاری دەکەین لەسەری،وە کردنەوەو (save) بەکارهێنانی لە کات و شوێنێکی دیکەدا وە چۆنێتی سڕینەوەی هەموو بابەتەکانی ناوی و فۆرمات کردنی ڕووندەکەینەوە.

یەکەم/ گواستنەوەی زانیاری بەهۆی فلۆپییەوە

1- فلۆپییەکەت بخەرە ناو فلۆپی درایڤەکەوە، بە شێوەیەکی زانستی و لەسەرخۆ.



2- ئەو هاردەی بابەت و زانیارییەکەی تێدایە کە دەتەوێت بیخەیتە سەر فلۆپییەکە بیکەرەوە.




3- سەهمی ماوسەکە ببە سەر فایلەکە (وێنە- نووسراو- ...) و کلیکی ڕاستی لەسەر بکە.




4- پاشان سەهمی ماوسەکە بهێنەرە سەر بەشی **send to** و کە بەهۆیەوە لیستێکی ترت بۆ دەکرێتەوە، لەم لیستەی کە بۆتکرایەوە کلیکی **Floppy A:** بکە.




پاش کەمێک چاوەڕوانی فایلەکە دەچێتە سەر فلۆپییەکە، دیارە دوای لاچوونی دایەلۆك بۆکسی هێمای گواستنەوەی فایلەکە بۆناو فلۆپییەکە.



# دووەم / کردنەوەی

# فلۆپی

دوای ئەوەی فایلەکەمان گواستەوە بۆسەر فلۆپییەکە، ئێستا فلۆپییەکە دەبەینە سەر ئەو کۆمپیوتەرەی کە دەمانەوێت کاری لەسەر بکەین و، دەیکەینەوە بەم شێوەیە:-

1- فلۆپییەکە بەشێوەیەکی لەسەرخۆ دروست دەخەینە ناو فلۆپی درایڤەکەوە.



2- بەشی My Computer بکەرەوە (وەك لە بەشی کردنەوەی ئایکۆنەکانی سەر ڕووی شاشە Desktop و فەرمانەکانی لیستی تاسك task menu دا باسمانکرد).




3- دواتر کلیك double click لەسەر بەشی Floppy A: بکە، بۆکردنەوەی فلۆپییەکە.



یان کلیکی ڕاستی لەسەر بکەو پاشان کلیک لەسەر بەشی open بکە لە لیستە نوێیەکەی کە بەهۆی کلیکی ڕاستەوە Right click بۆتکرایەوە.

کە فلۆپییەکەمان بۆ کرایەوە هەموو ئەو فایلانە دەبینین کە پێشتر گواستبوومانەوە بۆ سەری، یان هەڵمانگرتبوو پاراستبوومان لەسەری، کە بە دواوە کلیک double click لەسەر هەر کامێکیان دەکرێتەوەو چالاکدەبێت.




# سێهەم/ هەڵگرتن و پاراستنی زانیاری لەسەر فلۆپی

جیاوازی لەنێوان هەڵگرتن و پاراستنی زانیاری بەهۆی فلۆپییەوە لەگەڵ گواستنەوەی زانیاری بەهۆی فلۆپییەوە لەوەدایە کە لەم بارەدا لە پاراستن و هەڵگرتندا ڕاستەوخۆ فایلەکە لەسەر فلۆپی سەیڤ Save دەکەین، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم شێوەیە کار لەسەر فایلێکی وێرد دەکەین:-

1- دوای ئەوەی فایلێکمان ئامادەکرد، سەهمی ماوسەکە دەهێنینە سەر بەشی File و کلیک لەسەر دەکەین کە بەهۆیەوە لیستێکمان بۆ دەکرێتەوە.




2- لەو لیستەی بۆمانکرایەوە کلیک لەسەر Save یان Save as دەکەین، کەبەهۆیەوە دایەلۆگ بۆکسی سەیڤمان بۆدەکرێتەوە.








3- کلیك لەسەر سەھمە بچووکەکەی بەشی look in ی دیالۆگ بۆکسی Save دەکەین و بەھۆیەوە Floppy A: ھەڵدەبژێرین، دیارە بەکلیك کردن لەسەری.

دواتر ناوێك بۆ فایلەکە دەنووسین لەبەشی File name دوا لەبەشی File as type یشدا جۆری فایلەکە دیاریدەکەین.

.................................................................




4- لە کۆتاییدا کلیك لەسەر Save دەکەین و پاش کەمێك چاوەڕوانی فایلەکەمان بۆ سەیڤ دەبێت لەسەر فلۆپییەکە.

بۆ دیتنی بابەتەکە وەکردنەوەی فلۆپییەکە دەتوانین

ھەنگاوەکانی (دووەم/ کردنەوەی فلۆپی) جێبەجێ بکەین کە پێشتر باسمانکرد.



# چوارەم/ سڕینەوەو فۆرماتی فلۆپی



بۆئەوەی بەیەکجار هەموو فایلەکانی ناو فلۆپییەکەت بسڕیتەوەو فۆرماتی بکەیت پێویستە ئەم هەنگاوانە جێبەجێ بکەیت:-

1- فلۆپییەکە بخەرە ناو فلۆپی درایڤەکەوە.




2- بەشی My Computer بکەرەوە (وەك لە پێشەوە باسکرا).




3-سەهمی ماوسەکە ببە سەر بەشی Floppy A: کلیك ڕاستی لەسەربکە.




4- لەو لیستەدا کەبەهۆی کلیکە ڕاستەکەوە بۆتکرایەوە کلیکی فەرمانی Format بکە.

5- کلیك لەسەر دوگمەی start بکەو بووەستە تا فۆرماتەکە تەواو دەبێت و لە کۆتاییدا دایەلۆگ بۆکسەکە دابخە بە کردن لەسەر Close .







سەرنج:- جگە لەو شێوەیەی بۆ گواستنەوەی زانیاری بەهۆی فلۆپییەوە، شێوەی دیکەش کە هەمان کارمان بۆ بە ئە نجامدەگەیەنێت، بەم شێوەیە:-

1- ئەو هاردەی فایلەکەی تێدایە بیکەرەوە پاشان سەهمی ماوسەکە ببە سەر فایلەکەو کلیکی ڕاستی لەسەر بکە.



2- کلیك لەسەر بەشی Copy، یان Cut بکە، لەو لیستەدا کەبەهۆی کلیکی ڕاستەوە بۆتکرایەوە.




بەم شێوەیش نوسخەیەکی ئەو فایلەت دەستکەوت کە دەمانەوێت بیگوێزینەوە، بۆیە ئێستا فلۆپیەکە بکەرە ناو فلۆپی درایڤەکەوە بیکەرەوە پاشان کلیکی ڕاست بکە دواتر کلیك لەسەر بەشی Past بکە بەم شێوەیش ئەو نووسخەیەی دەستمانکەوت لە فلۆپییەکەدا دایدەنێینەوە ئێستا دەتوانین ئەو فایلە بگوێزینەوە.

سەرنج:- بۆئەوەی بەهەڵەدا نەچین لە کلیك کردن لەسەر بەشی Copy یان Cut پێویستە بزانین جیاوازی لەنێوان ئەو دووانەدا چییە؟ دیارە بەکلیك کردن لەسەر کۆپی Copy نووسخەیەکی ئەو فایلەمان دەستدەکەوێت بێ ئەوەی فایلەکە هیچی بەسەربێت، بەڵام بە کلیك کردن لەسەر Cut ئەوا فایلەکە لە جێگەی خۆی نامێنێ، لادەچێت و تەنها نووسخەیەکی نوێمان لێی دەست دەکەوێت و هیچی‌تر.




بەکارهێنانی سی دی CD

سیدیش وەك فلۆپی بۆ گواستنەوەی زانیاری هەڵگرتن و پاراستنی Save زانیاری لەسەری سوودی لێوەردەگیرێت، بەڵام لەمبارەدا دەبێت کۆمپیوتەرەکەمان Write...CD ی لەسەر بێت، کە کەم کۆمپیوتەر لەسەریێتی چونکە زۆر گرنگ نییە بۆیە کەمتر بۆ گواستنەوەی زانیاری بەکاردەهێنرێت، بەڵام بۆ مەبەستی پاراستن و هەڵگرتنی زانیاری زۆر باشەوە زۆربەی فیلم و مۆسیقاو بەرنامەو، وێنەو، دەقەکان لەناو سیدیدا هەڵدەگیرێن و دەپارێزرێن.



# بەکارهێنان و کردنەوەی سیدی



لێرەدا باسی یەکێك لە بەکارهێنانی سی دی دەکەین کە کردنەوەیەتی بۆ بینینی ئەو زانیاری‌و شتانەی کە لەناویدایە، بۆ ئەم مەبەستەش سیدی نەقش ئەفرینانی فارسی بەکاردەهێنین:-

1- سیدی نەقش ئەفرینان دەخەینە ناو سیدی درایڤەکەوە.




2- بەشی My Computer دەکەینەوە.

3- کلیك لەسەر بەشی تایبەت بە سیدی دەکەین کە وێنەی سیدییەکی تیادایەو لە تەنیشتیدا نووسراوە CD Drive (F:)




بەم شێوەیە سیدییەکەمان بۆ دەکاتەوەو پێکهاتەی ناو سیدییەکە دەبینین و دەتوانین کاری لەسەر بکەین.



# گۆڕینی باگگراوەندی شاشە و... دانانی شاشەی پاراستن

گۆڕینی باکگراوەندی شاشەو ... دانانی شاشەی پاراستن




یەکەم/ ڕەنگە من حەزم لە وێنەو شێوەیەکی باکگراوەند بێت بەڵام تۆ حەزت لە وێنەو شێوەیەکی تر بێت، یەکێکی دی بەهەمان شێوە بۆیە پێویستە هەریەك لەئێمە بزانین چۆن باکگراوەندی شاشەکەمان دەگۆڕین، کەزۆر ئاسانەو بەهۆی بەئەنجامگەیاندنی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە دەتوانیت ئەم کارە بکەیت:-

1- لە شوێنێکی سەر ڕووی شاشەکەدا کلیکی ڕاست Right click بکە.




2- سەهمی ماوسەکە بهێنەرە سەر بەشی Properties و کلیکی لەسەر بکە کە بەهۆیەوە دایەلۆگ بۆکسێکت بۆ دەکرێتەوە.



3- لەبەشی سەرەوەی ئەودایەلۆگ بۆکسەی بۆتکرایەوە کلیکی Desktop بکە.

پاشان لەبەشی Background دا کلیکی ئەو وێنەو شێوانە بکە کە بەڕیز دانراون تا دەگەینە ئەو دانەیەی بە دڵتەوە لات گونجاوە، وە ئەگەر هیچ کام لەوانەت بە دڵ نەبوو دەتوانیت بەهۆی بەشی Browser ـەوە چ وێنەو شێوەیەکت حەز لێیە بیهێنیت جا لە فلۆپیدایە، یان لە فلاشدا، یان لە هاردەکاندا هیچ گرنگ نیە.







4- لەبەشی Position دا حاڵەتێك هەڵبژێرە بۆ باكگراوندەكە بەتایبەتی ئەوانەی بەهۆی Browser ەوە دەیانهێنین، وە لەبەشی Color دا ڕەنگێك هەڵبژێرە.



5- لە کۆتاییدا کلیك لەسەر دوگمەی Apply بکە، بەمەش بەرلەوەی OK بکەیت ئەو شێوەیەی هەڵتبژاردووە لەسەر ڕووی شاشەکە دەردەکەوێ، کە ئەگەر بە دڵت نەبوو دەتوانی بیگۆڕیت و پاشان OK بکەیت.



دووەم/ ڕەنگە بەرنامەیەکت کردبێتەوە لە پڕێکدا کارێکی زۆر گرنگ بێتە پێشەوە پێویست نەکات بەرنامەکە دا بخەیتەوە، یان کۆمپیوتەرەکە بکوژێنیتەوە ئەوا لەو کاتادا سوود لەشاشەی پاراستن Screen Saver وەردەگریت بۆئەوەی تا ئەو کاتەی دەگەڕێیتەوە سەر کارەکەت کەس نەیبینێت، بەم شێوەیە:-



1- لەسەر شوێنێکی سەر ڕووی شاشەکە Desktop کلیک ڕاست Right click بکە.



2- سەهمی ماوسەکە بهێنە سەر بەشی Properties و کلیکیلەسەر بکە.




3- کلیك لەسەر بەشی Screen Saver ی بەشی سەرەوەی ئەو دایەلۆگ بۆکسە بکە کە بۆتکراوەتەوە:






4- لەبەشی Screen Saver ی ژێر وێنەی کۆمپیوتەرەکەدا شێوەیەك هەڵبژێرە و دەتوانیت کلیك لەسەر Preview بکەیت بۆ پیشاندانی ئەو شێوەیە هەڵتبژاردووە بەرلەوەی OK بکەیت، کە پیشانی دایت و بە دڵت بوو ماوسەکە بجووڵێنە بۆئەوەی دایەلۆگ بۆکسەکە دەربکەوێتەوە.




5- لەبەشی چاوەڕوانیدا Wait دیاری بکە کە پاش چەند دەقیقە لە کارنەکردن لەسەری ئەو شاشە پارێزەرە دەردەکەوێت، ئێمە 15 دەقەمان هەڵبژاردووە.

6- لە کۆتاییدا کلیك لەسەر OK بکە.



# دابەزاندنی بەرنامە



چۆنییەتی دابەزاندنی بەرنامە یەکێکە لە پێویستی یە هەرەگرنگەکانی بەکارهێنەری کۆمپیوتەی کەدەبێت بیزانێت و، جیاوازییەکی ئەوتۆش لەنێوان دابەزاندنەکاندا نییە مەگەر جیاوازییەکی زۆر کەم نەبێت ، ئێمە لێرەدا باس لە دابەزاندنی بەرنامەی فۆتۆشۆپ سی ئێس دوو Adobe photo shop cs 2 دەکەین وەك نموونەیەك بۆ دابەزاندنی بەرنامەکان بەو هیوایەی تۆی فێرخوازیش بتوانیت لەسەر بەرنامەی دیکە تاقیبکەیتەوە ،بەم شێوەیە :

1-سیدی بەرنامەی فۆتۆشۆپ سی ئێ ، بخەرە ناو cdromەکەوە .




2-بەشی my computer لە سەر ڕووی شاشەکە desk topبکەرەوە. (یان بەهۆی task menuوە وە بیکەرەوە)




3-دووانە کلیك لەسەر بەشی cdبکە، کە وێنەی سی دی یەکی لەسەرە بۆ کردنەوەی بەرنامەی ناو سیدییەکە، کە فۆتۆشۆپ سی ئێسە. سەرنج ( لێرەدا وێنەی سی دی یەکە گۆڕاوە بۆ وێنەی خانویەك کە سیدی فۆتۆشۆپەکەیە )



4- پاشان سیدییەکەمان بۆ دەکرێتەوە کەلە چەند بەشێك پێکهاتووە وەك لە وێنەکەدا دیارە و ، ئێمە، ئەو بەشە هەڵدەبژێرین و کلیك لەسەر دەکەین کەدەمانەوێت دایبەزێنین، کەلێرەدا فۆتۆشۆپ سی ئێسە .

سەرنج : ( ئەگەر سید یییەکەمان بۆ کرایەوە و ، بەو شێوەیە نەبوو کە لەوێنەکەدا دیارە، و بەشێوەی فولدەربوو، ئەوا دووانە کلیك لەسەر فولدەری ئەو بەرنامەیەدەکەین کە دەمانەوێت دایبەزێنین، یان کلیکی ڕاستی لەسەر دەکەین و، پاشان کلیك open دەکەین لەو لیستە نوێ یەی کەبەهۆی کلیکی ڕاستەوە بۆمان کراوەتەوە )




5- دوای ئەوەی کلیکمان لەسەربەشی install Adobe Photoshop *9 CS2کرد، هەنگاوێکی نوێ دێتە پێشەوە کە تاییەتە بەدابەزاندنی بەرنامەی فۆتۆشۆپ سی ئێس کە هەنگاوی ئامادەکاری کۆمپیوتەرەکەمان بۆ دابەزاندنی بەرنامەکە.




6- هەنووکە لە هەنگاوێکی نوێ داین، کە دایەلۆگ بۆکسێکمان بۆ کراوەتەوە و ، دەبێت کلیك دووگمەی nextبکەین، بۆ ئەوەی بچینە هەنگاوێك پێش.






7- بەكليك كردنی دووگمەی next لە دايەلۆگ بۆكسەكەی پێشوودا، دايەلۆك بۆ كسێكی بچوكمان بۆ دەكرێتەوە لەسەر دايەلۆگ بۆكسەكەی پێشوو، كەدەبێت بۆ بەردەوام بوونی كارەكەمان كليك لە سەر yesبكەين .




8-كليك لەسەر دووگمەی acceptبكە بۆ بەردەوامی كارەكەمان تابتوانيت بەهۆيەوە كارەكەمان ئەنجامبدەين و بەرنامەكە دابەزێنين، .




9-بەكليك كردن لەسەر acceptلە خاڵی پێشوودا دالۆگ بۆكسێكی نوێت بۆ دەكرێتەوە كەدەبێت سيريەڵی بەرنامەكەی تيابنووسيت ، پاشان كليك لەسەر دووگمەی nextبكەيت .






10-بەكليك كردن لەسەر nextلە پێشوودا ئەم دايەلۆگە بۆكسە نوێ يەت بۆ دەكرێتەوە كە تيايدا شوێنی دانانی بەرنامەكەی بۆت نووسيوە لەناو كۆمپيوتەرەكەدا، كە دەتوانيت بە خواستی خۆت بيگۆڕيت، يان فەرامۆشی بكەيت.چونكە خۆی بۆت دەخاتە ليستی بەرنامەكانی ديكەی ناو كۆمپيوتەرەكەتەوە .

ئەگەر گۆڕان ئەنجام نادەيت، كە واباشترە شوێنەكەی خۆی نەگۆڕيت، دەتوانيت كليك لەسەر nextبكەيت، بۆ چونە پێشەوەی هەنگاوێكی تر .




11-پاشان كليك لەسەر nextدەكەين .




12-ئێستا لە دالۆگ بۆ كسی پێش كۆتاييداين، وەك لە وێنەكەدا ديارە ، بۆئەوەی بگەينە دووا هەنگاو، دوا دايەلۆگ بۆكس و بەرنامەكە، تەواو دابمەزێت كليك Installدەكەين .

ئێستا کۆمپیوتەرەکە دەست دەکات بە دابەزاندنی بەرنامەی فۆتۆشۆپ .




13-لە کۆتاییدا کلیك لە سەر دووگمەی finishبکە .




لێرەدا دابەزاندنی بەرنامەکە کۆتای هات و، دەتوانیت بۆ بینینی فۆتۆشۆپ سەردانی لیستی taskبکەیت



# بڵاوکراوەی تەکنیکی




## رێبەری سایتە کوردییەکان
## Kurdish site guide

**کتێبی : رێبەری سایتە کوردییەکان**

**ئامادەکردنی : هێمن مەلا کەریم بەرزنجی**

**ساڵی چاپ:2004**

**تیراژ:1000دانە**

**چاپخانەی : پەیڤ**

**-لەسەر ئەرکی نووسەر لەچاپدراوە**

**-یەکەم بەرهەمی کتێبی نووسەر**

---

# فێربوونی بەکارهێنانی تۆڕی ئینتەرنێت




**کتێبی : فێربوونی بەکارهێنانی تۆڕی ئینتەرنێت**

**نووسینی :هێمن مەلا کەریم بەرزنجی**

**ساڵی چاپ: 2005**

**تیراژ:1000دانە**

**چاپخانەی : پەیڤ**

**شانزەهەمین بەرهەمی کتێبی نووسەر**

**هەنووکە لە بازاڕدایە**

# بڵاوکراوەی تەکنیکی




## فۆتۆشۆپ سی ئێس – هەشت

کتێبی : فۆتۆشۆپ سی ئێس (هەشت)

نووسینی : هێمن مەلا کەریم بەرزنجی

تیراژ:1000دانە

چاپخانەی : پەیڤ

ساڵی چاپ:2005

نەخشەسازی ناوەوە:هێمن

نەخشەسازی بەرگ : چاپخانەی دیلان

-دووەم بەرهەمی کتێبی نووسەر








# سڕینەوەی بەرنامە




بێگومان بەرنامەی زۆر کۆمپیوتەرەکەت قورس دەکات و خاوی دەکاتەوە، یان زیانی پێدەگەیەنێت بۆیە دوای ئەوەی کارت بە بەرنامەیەك نەما، جا بۆ هەمیشەیی بێت، یان بۆ ماوەیەکی زۆر کارت پێی نەمابێت و کاری پێنەکەیت، وا باشترە ئەوە بەرنامەیە لە کۆمپیوتەرەکەتدا بسڕیتەوە، کە ئەم کارەش زۆر ئاسانەوە بەهۆی بەجێگەیاندنی ئەم خاڵانەی لای خوارەوە بە ئاسانترین شێوە دەکرێت:-

1- بەشی My Computer کە دەکەوێتە سەر ڕووی شاشەکە Desktop بکەرەوە.




2- لەبەشی other place دا کلیك لەسەر شوێنی control panel بکە.






3- دوای کرانەوەی پەنجەرەی control panelدووانە کلیك لەسەر بەشی add or remove programs بکە.




4- کام بەرنامەیە کار پێناکەیت و دەتەوێت بیسڕیتەوە سەهمی ماوسەکەی بهێنەسەر و کلیکی لەسەر بکە.




5- سەهمی ماوسەکە بهێنە سەر دوگمەی Remove و کلیکی لەسەر بکە.

ئەگەر پەنجەرەیەکی بچووك بۆ کرایەوە کە لە دوو هەڵبژاردنی Yes و No – ی تیادابوو ئەوا کلیکی Yes بکە.



# مایکرۆسۆفت ویندۆز ڤیستا

## چاوەڕێبن ... بەم زووانە

نوێترین ویندۆز ....





# گۆڕینی بەروار و ... کات

بۆ گۆڕینی بەرواروو کات ئەم هەنگاوانە دەگرینە بەر :

1- دووانە کلیك لەسەر هێمای کات ژمێرەکەی سەر task barەکەدەین :




2- بەهۆیەوە دالۆگ بۆ کسێکمان بۆ دەکرێتەوە وەك لەوێنەکەدا دیارە:








3- بەهۆی بەشی date and timeەوە گۆڕان لەڕۆژو کاتدا دەکەین گەر هەڵەبوو.

4-بەهۆی بەشی time zone-ەوە، دەتوانیت کات دیاری بکەیت، بەگوێرەی ئەو وڵاتەی خۆت دەتەوێت، بە شێوەی GMTکە پێوەرێکی جیهانییە.

5-بەهۆی internet time-ەوە دەتوانین کات تەوقیت بکەین بەهۆی ئینتەرنێتەوە .




*لەکۆتای کارەکا نماندا دەبێت کلیك لەسەر okبکەین، یان لەسەر Applyکلیك بکەین بۆ ئەوەی ئە نجامی کارەکەمان ببینین پێش کلیك کردن لەسەر ok، پاشان کلیك لەسەر okبکەین، ئەگەر ئە نجامەکەمان بەدڵبوو .

## کۆتـــــــــــــــــایـــــــــــــــی

بەرهەمی ئایندە ...چاوەڕێبن ...

ڕێبەری وێنەیی هاڵپەرە جیهانییەکان